# ٥٠ گـــــوڵ

# لە باخچەی ئامۆژگاری

# بۆ کچان و ئافرەتانی موسڵمان

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٥٠ گـــــوڵ
# لە باخچەی ئامۆژگاری
# بۆ کچان و ئافرەتانی موسڵمان

نووسینی
عبدالعزیز عبدالله المقبل

وەرگێڕانی
عبدالسلام فاتح عبدالرحمن

١٤٤٦ک ٢٧٢٤ک ٢٠٢٥ز

٥٠ گوڵ  لە باخچەی ئامۆژگاری بۆ کچان و ئافرەتانی موسڵماني

نووسینی: عبدالعزيز عبدالله المقبل

وەرگێڕانی: عبدالسلام فاتح عبدالرحمن

چاپی یەکەم  ٢٠٢٥

لا پەڕە: ٤٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله صل الله عليه وسلم، وبعد:**

**خوشکی موسڵمانم:**

یەکێک لەو شتە گرنگانەی کە پیاو یان ئافرەتی موسڵمان پێی تایبەتمەندە ئەوەیە کە دڵیان بە خوداوە گرێدراوە و یاسای ئەویان لە ژیانیاندا جێبەجێ کردووە و پابەندی فەرمانەکانی بوونە، بێگومان ئەوەش هۆکاری سەرەکی ئاسوودەیی دەروونی و دڵئارامییە، بۆیە هیچ شتێک لە ڕووخساریاندا بەدی ناکرێت جگە لە زەردەخەنە، تەنانەت لە تاریکترین و سەختترین بارودۆخدا، ئەوان تێدەگەن کە ئەوەی بەسەریاندا هاتووە نەدەبوو بەسەریان نەیەت، ئەوەش کە تووشیان نەبووە نەدەبوو تووشیان بێت، بۆیە دڵتەنگ نابن و بێزاری دەرنابڕن بە لەدەستدانی شتێک یان کەسێک کە خۆشیان ویستووە، هەروەها بە هاتنی شتێکی خراپیش ناڕووخێن، چونکە لەو ڕاستیە باش تێگەیشتوون کە ڕەنگە لە پشتی ئەو شتەوە کە ئەمان حەزیان لێی بووە و ئارەزوویان کردووە شتێکی ناخۆش هەبووبێت، لە پشتی شتە ناخۆشەکەشەوە شتێکی

خۆش هەبێت و لە دوور مەودادا بە خێر بشکێتەوە، هەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەیان لەبیرە: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ [البقرة: ٢١٦]. واتە: لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن.

جوانی و شتە ڕازاوەکانی دونیا فریویان نادات و لەخشتەیان نابات، چونکە دەزانن تەمەنی دونیا کورتە و پڕە لە سەختی و ناڕەحەتی، شایەنی ئەوە نییە مرۆڤ بیکات بە شوێنی نیشتەجێ بوونی هەتا هەتایی و لە پێناویدا تووڕە و غەمبار بێت، یان دڵتەنگ بێت بە لەدەستدانی هیچ کام لە شتەکانی، چونکە بە بەراورد بە ژیانی دوای مردن شایانی هیچ نییە، ئەو ژیانەی کە شوێنی پشوودانی هەقیقییە، خۆشبەختی هەمیشەیی تێدایە، شتانێکی تێیدایە هیچ چاوێک نەیبینیوە، هیچ گوێچکەیەک نەیبیستووە، بەدڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتووە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مانای ئەوە نییە مرۆڤ دەست لە هەموو خۆشییەکی دونیا بەردات، نا بەڵکوو بەپێی پێویست و بەبێ زێدەڕۆیی دروستە مرۆڤ

تێیدا ڕابوێرێت و خۆشی ببینێت، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ [القصص: ٧٧].

واتە: هەوڵبدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیووی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕە و بەشی خۆشت لە دنیادا بەحەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەک خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناهـ و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت تۆوی خراپە دەچێنن.

**خوشکی موسڵمانم:**

ئەگەر دونیا لە سەختی و هەموو بەڵایەک بەدوور بووایە - کە ئەوەش ئەستەمە- ئەوا تەنها یادکردنەوەی مردن هەموو خۆشی و شیرینییەکانی تاڵ دەکرد، تەمەنی درێژی تێدا بەکەم پیشان دەدا، شتی زۆری بەکەم وێنا دەکرد، شتە جوان و ڕازاوەکانی بەلێڵ و ناخۆش وەسف دەکرد، ئەمە ئەگەر مرۆڤ تەمەنێکی درێژی بۆ گەرەنتی کراو بوایە، کەواتە دەبێ حاڵی چۆن بێت ئەگەر بەیانی کردەوە دڵنیا نەبێت لەوەی

ئێوارە ناکاتەوە، وە ئەگەر ئێوارەی بەسەردا هات بترسێت نەگاتە بەیانی!؟

کاتێک هەوری کارەسات دەڕوێتەوە، یەکێکی تر دێت، لەدەستدانی کەسانی هاوڕێ و نزیک ڕایدەچەڵەکێنێت، کاتێک هەست بە ئازارێکی ناوبەناو دەکات لە یەکێک لە ئەندامەکانیدا، یان هەست بە زیادبوونی لێدانی دڵی دەکات، یان هەست بە کەمیی دەکات لە ئارەزووی خواردن، جنۆکەی مردن لەبەردەم چاویدا دەردەکەوێت و تووشی شۆک دەبێت و نەخۆشیەکەی زیاتر دەبێت و توندتر دەبێت و هەست بە تەنیایی دەکات، وەک ئەوەی ئەو ترسە ڕێگری بکات لە دابەزین مردن یان دووری بخاتەوە.

مرۆڤ چەند لاوازە، چەندە بچووک و بێ بایەخە، دەبینی گەنجێکی جوان و ڕەونەقدارە، پڕ لە وزە و زیندوویی و تازەیی و چالاکیی، جەستەیەکی پڕ وزە و چەور، کەچی زۆری پێناچێت تەمەن دەیباتە پاییزی خۆی و پشتی دەچەمێتەوە و دەموچاوی چرچ و لۆچ دەبێت، بە بچووکترین هەوڵ ماندوو و لاواز دەبێت، بە کەمترین کار هەست بە ماندوو بوون دەکات.

پیاوێکی دەوڵەمەند دەبینیت، لە کۆشکێکی نایابدا دەژی، سواری ئۆتۆمبێلێکی گرانبەها دەبێت و لەسەر جێگا و ڕاخەرێکی ئارام دادەنیشێت، پاشان ڕۆژگار گۆڕانکاری بەسەردا دێت، لە شوێنێکدا دەژی کە پێشتر بەهیچی نەدەزانی، سواری شتێک دەبێت کە پێشتر بێزی دەکردەوە لە سواربوونی، شتێک لەبەر دەکات کە پێشتر بێزی نەدەهات سەیریشی بکات، خواردنێک دەخوات پێشتر ئامادە نەبوو بیخوات و لوتی بەلادا بکات.

چێژ و جوانی ژیان، لوتکەی بەختەوەری و کامڵبوونی، تەنیا لە گوێڕایەڵی خودادا دەدۆزرێتەوە، کە مرۆڤ جگە لە پابەندبوون بە فەرمانی خودا و شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی، هیچی تری لێداواناکرێت، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەژیاندا بە ویژدانێکی ئارامەوە بژی، دەروونێکی ئاسوودە، ڕۆحێکی ئارام، بەختەوەریەکی بەردەوام، کەسێکی ڕەوشت جوان، لەو کەسانە خۆش بێت کە ستەمیان لێکردووە، لە سەرپێچیی ئەو کەسانە خۆش دەبێت کە خراپەیان بەرانبەر کردووە، بەزەیی بە بچووکەکاندا بێتەوە و ڕێز لە پیرەکان بگرێت.

کەسێکی لێدەربچێت، کە زۆر حەزی لە دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵکە، لە خزمەتیاندا بێت، بەئارام بێت

لەبەرانبەر ئەزیەت و زیانەکانیان، لە هیچ شتێکی بچووک و گەورە کەمتەرخەمی نەکات سەبارەت بە فەرمانی خودا، بەڵکوو هەوڵبدات هەموو کارێک بکات کە لەخودای نزیک بکاتەوە و خۆشەویستی بکات لای، کاتێ تووشی بەڵا و ناڕەحەتیەک دەبێت بە سەبر و ڕازیبوونەوە ڕووبەڕوویان ببێتەوە، کاتێکیش مردن دێت، وەک ڕزگاربوون لە ناڕەحەتیەکان و گەشتێک بە بەهەشتی نەبڕاوە لێکدانەوەی بۆ بکات.

**خوشکی موسڵمانم:**

لەم چەند لاپەڕەیەدا کۆمەڵێک ئامۆژگاری و ڕێنمایی هەیە، کە کاتێک لە واقیعی ژیانتدا جێبەجێیان دەکەیت، حەزت لێیە دەستیان پێوە بگریت، پەشیمانی دەردەبڕیت لە بیرکردنیان، ئەگەر وات کرد، ئەوا بێگومان ژیانت لە نەهامەتییەوە دەگۆڕێت بۆ ئاسوودەیی، لە بەدبەختییەوە بۆ بەختەوەری، بەڵکوو ژیان تامێکی تر دەدات و لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە سەیری دەکەیت، ئەو شتەی بۆتە پاڵنەر بۆ ئەوەی ئەم ئامۆژگاریانە بینووسرێت خۆشەویستی چاکە و ئارەزووی پاداشت و ئارەزووی چاکسازی و

خۆشگوزەرانییە، بۆیە با هەنگاو بنێین بەرەو ئەو ئامۆژگارییە بەنرخانە، خوای گەورە سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت.

قســـە:

**خوشکی موسڵمانم:**

١- ئاگاداری قسە و قسەڵۆک و زۆر بڵێی و زیادەڕەوی بن لە قسەکردندا، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ [النساء: ١١٤]. واتە: لە زۆربەی چپە و سرتە و قسە نهێنیەکانیاندا هیچ خێرێک بەدی ناکرێت و تیایدا نییە، مەگەر چپەی ئەو کەسەی کە فەرمان بدات بە بەخششێک، یان چاکەیەک، یان ڕێکخستن و چاکسازی و ئاشتبوونەوەیەکی نێوان خەڵکی.

باش بزانە کەسانێک هەن قسەکانت دەژمێرن و دەینووسن و لەسەرتی تۆمار دەکەن، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ۝١٧ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ [ق: ١٧- ١٨]. واتە: کەلەلای ڕاست و چەپیەوە دانیشتوون، (هەموو گوفتارو کردارێکی تۆمار دەکەن بەدەزگای زۆر

پێشکەوتوو). هەر قسەیەکی لەدەم دەردەچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە، تۆماری دەکات.

بۆیە با قسەکانت کورت و ورد بن و یەکبگرنەوە لەگەڵ ئەو مەبەستەی کە لە پێناویدا قسە دەکەیت.

٢- قورئانی پیرۆز بخوێنەوە، سوور بە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژانە بیخوێنیت، هەوڵبدە تا دەتوانیت لەبەری بکەیت، بۆ ئەوەی پاداشتی گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بەدەستبهێنیت، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە -خوای گەورە لە هەردووکیان ڕازی بێت- هاتووە، لە پێغەمبەرەوە -ﷺ- کە فەرموویەتی: «**يُقَالُ لِصاحِبِ الْقُرَآنِ: اقْرأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَما كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإنَّ منْزِلَتَكَ عِنْدَ آخِرِ آيةٍ تَقْرَؤُهَا**» (١).

---

(١) أخرجه أَبو داود، والترمْذي وَقالَ: حديث حسن صحيح. وقال الألباني في صحيح سنن أبي داود: (١ /٤٠٣): «حسن صحيح». شەرحی فەرموودەکە: «**يُقَالُ**» دەگوترێت، واتە: لەکاتی چوونە بەهەشت. «**لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ**» بەهاوەڵی قورئان، واتە ئەو کەسەی لە خوێندنەوە و کارکردەوەدا پێیەوە پابەند بێت، نەک ئەو کەسەی کە دەیخوێنێتەوە و کار لەسەری ناکات. «**اِقْرَأْ وَارْتَقِ**» بخوێنەوە و بەرز بەرەوە، واتە بۆ پلە هەرە بەرزەکانی بەهەشت یان ئاستەکانی نزیکایەتی لە خودا. «**وَرَتِّلْ**» بخوێنە، واتە پەلە مەکە لە خوێندنەوەت لە بەهەشتدا. «**كَمَا كُنْت تُرَتِّلُ**» هەروەک چۆن دەتخوێند، واتە: وەک چۆن لە دونیادا بەلەسەر خۆییەوە دەتخوێند. بڕوانە: عون المعبود شرح سنن أبي داود: (٤ /٢٣٧) ترقيم الشاملة.

واتە: بە هاوەڵ و دۆستی قورئان دەگوترێ: قورئان بخوێنەرەوە و بەرز ببەرەوە، بە لەسەرخۆیی و بەجوانی بیخوێنەرەوە، هەروەک چۆن لە دونیادا دەتخوێندەوە، بەڕاستی شوێنی تۆ لەگەڵ تەواوبونی کۆتا ئایەتدایە، کە دەیخوێنیتەوە.

[ئیمامی خەتتابی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەڵێت: «**جَاءَ فِي الْأَثَرِ أَنَّ عَدَدَ آيِ الْقُرْآنِ عَلَى قدر درج الجنة في الاخرة فيقال للقاري ارْقَ فِي الدَّرَجِ عَلَى قَدْرِ مَا كُنْتَ تَقْرَأُ مِنْ آيِ الْقُرْآنِ فَمَنِ اسْتَوْفَى قِرَاءَةَ جَمِيعِ الْقُرْآنِ اسْتَوْلَى عَلَى أَقْصَى دَرَجِ الْجَنَّةِ فِي الْآخِرَةِ وَمَنْ قَرَأَ جُزْءًا مِنْهُ كَانَ رُقِيُّهُ فِي الدَّرَجِ عَلَى قَدْرِ ذَلِكَ، فَيَكُونُ مُنْتَهَى الثَّوَابِ عِنْدَ مُنْتَهَى الْقِرَاءَةِ**» [٢].

واتە: لە ئەسەرێکدا هاتووە کە ژمارەی ئایەتەکانی قورئان یەکسانە بە ژمارەی پلیکانەکانی بەهەشت لە قیامەتدا، بۆیە بە خوێنەر دەگوترێت: بە پێی بڕی ئایەتەکانی قورئان کە پێشتر دەتخوێندەوە، بە پلیکانەکاندا سەرکەوە، بۆیە هەر کەسێک خوێندنەوەی هەموو قورئانی تەواو کردبێت، ئەوا لە قیامەتدا دەگات بە بەرزترین پلە و ئاستی بەهەشت، هەر کەسێک بەشێکی بخوێنێتەوە، بەرزکردنەوەی پلیکانەکانی بەڕێژەی

---

(٢) بڕوانە: تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي: (٨ /١٨٧).

ئەوە دەبێت، کەواتە پاداشتەکەی بە ئەندازەی ئەوەندەیە کە خوێندنوویەتی لە قورئان].

٣- جوان و باش نییە باسی هەموو ئەو شتانە بکەیت کە بیستووتە، بەو پێیەی ئەمە مەترسی تووش بوون بە درۆکردنی لێدەکرێت، لە ئەبوو هورەیرەوە -خوای گەورە لێی ڕازی بێت- هاتووە، کە پێغەمبەر -ﷺ- فەرموویەتی: «**كَفَى بالمرءِ كذِبًا أن يحدِّثَ بِكُلِّ ما سمِعَ**» [٣]. واتە بەسە بۆ مرۆڤ بە درۆزن بژمێردرێت، بەوەی هەرچی گوێ لێبێ باسی بکات و بیگێڕێتەوە.

٤- ئامان ئاگاداری خۆ هەڵکێشان و خۆ بەرز گرتن و شانازی کردن بە بەوەی کە نیتە، لە پێناو خۆ دەرخستن و فشەکردن و خۆ هەڵکێشان لە پێش چاوی خەڵکی، خاتوو عائیشە -خوای لێ ڕازی بێت- دەڵێت: «**أنَّ امرأةً جاءَتِ النَّبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فقالت: يا رَسولَ اللهِ، إنَّ لي زَوجًا، ولي ضَرَّةٌ، وإنِّي أتشَبَّعُ مِن زَوجي، أقولُ: أعطاني كذا، وكساني كذا، وهو كَذِبٌ؟ فقال رَسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ:**

(٣) أخرجه مسلم في (مقدمة الصحيح) (٥)، وأبو داود (٤٩٩٢)، وابن حبان (٣٠) من حديث أبي هريرة.

**المُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ»** [٤]. واتە: ئافرەتێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- من مێردم هەیە، هەوێیەکیشم هەیە، لای خەڵکی دەڵێم: هاوسەرەکەم پێم دەدات، دەڵێم: فڵانی پێدام، فڵانی جلی بۆ کردووم، بەڵام بەو شێوەیە نییە و نامداتێ؟ پێغەمبەر -ﷺ- فەرمووی: تێری پێ نەدراو وەک لەبەرکەری پۆشاکی درۆیینە وایە.

٥- بەڕاستی زیکر و یادی خوای گەورە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر ژیانی گیانی و دەروونی و لاشەیی و کۆمەڵایەتی موسڵمان، بۆیە سوور بە لەسەر ئەوەی زیکر و یادی خوای گەورە بکەیت لە هەموو کات و حاڵەتێکدا، چونکە خوای گەورە وەسف و مەدحی بەندە دڵسۆزەکانی خۆی دەکات و دەفەرمووێت: ﴿ **ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ** ﴾ [آل عمران: ١٩١]. واتە: ئەوانەی یادی خوای گەورە دەکەن بە پێوە و بە دانیشتنەوە و لەسەر لایەکانیان.

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر -خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت: **«أنَّ رَجُلًا قالَ يا رسولَ اللهِ إنَّ شرائعَ الإسلامِ قد كثُرت عليَّ فأخبِرني بشيءٍ أتشبَّثُ به قال: لا يزالُ لسانُك رطبًا من ذكرِ**

---

(٤) أخرجه مسلم (٢١٢٩).

اللهِ»[٥]. واتە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا -ﷺ- شەریعەتی ئیسلام زۆرە لەسەرم، شتێکم پێ بڵێ دەستی پێوە بگرم؟ پێغەمبەر -ﷺ- فەرمووی: با بەردەوام زمانت پاراو و تەڕ بێت بە زیکر و یادی خوای گەورە.

٦- ئەگەر ویستت قسە بکەیت، ئەوا ئاگاداربە لە خۆبەگەورە زانین و زمان لوسی و ڕۆچوون لە قسە کردندا، چونکە ئەمە سیفەتێکی ناپەسەند و خۆشنەویستراوە لای پێغەمبەر -ﷺ- هەروەک دەفەرموێت: «**وإنَّ مِن أبغضِكُم إليَّ وأبعدِكُم منِّي يومَ القيامةِ الثَّرثارونَ والمتشدِّقونَ والمتفَيهِقونَ**»[٦]. واتە: ناپەسەندترین و ڕق لێبووترین کەستان لای من و دوورترینتان لە من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسانەن کە زۆر بلێ و ڕۆچون لە قسەدا و خۆبەزلزانن تێیدا.

٧- پێغەمبەر -ﷺ- بکە بە سەرمەشق و پێشەوای خۆت لە هەموو شتێکدا لە کەم قسە کردن و قوڵ بیرکردنەوە و کەم پێکەنین و ڕۆنەچوون تێیدا، لە سەمماکی کوڕی حەربەوە هاتووە، دەڵێت: «**قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَكُنْتَ تُجَالِسُ رَسُولَ**

---

(٥) أخرجه الترمذي (٣٣٧٥). وصححه الألباني في صحيح الترمذي (٣٣٧٥).

(٦) أخرجه الترمذي (٢٠١٨)، وصححه الألباني في صحيح الترمذي (٢٠١٨).

**اللهِ صلى الله عليه وسلم؟ قالَ: نَعَمْ، وكانَ طَويلَ الصَّمتِ، قَليلَ الضَّحِكِ، وكانَ أصحابُهُ يَذكُرونَ عِندَهُ الشِّعرَ، وأشياءَ مِن أُمورِهم، فيَضحَكونَ، ورُبَّما تَبَسَّمَ»**(٧).

واتە: بە جابری کوڕی سەمورەم گوت: ئایا تۆ لەگەڵ پێغەمبەر -ﷺ- دادەنیشتی؟ گوتی: بەڵێ، زۆر بێدەنگ بوو، کەم پێدەکەنی، هاوەڵانی باسی شیعر و کاروباری خۆیان دەکرد و پێدەکەنین، بەڵام پێغەمبەر-ﷺ- هەندێ جار زەردخەندەی دەکرد.

قسە کردنت -ئەگەر قسەت کرد- با بەچاکە بێت، ئەگەر نا بێدەنگی باشترە بۆت، پێغەمبەر-ﷺ- دەفەرموویێت: «**مَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ والْيَومِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا، أوْ لِيصْمُتْ**»(٨). واتە: هەر کەسێک باوەڕی هەیە بە خوای گەورە و بە ڕۆژی دوایی با چاک بڵێت یان بێدەنگ بێت.

٨- وریا بە قسە بەخەڵکی نەبڕیت، یان بەتوندی و ڕەقی وەڵامیان بدەیتەوە، یان بەکەمی بزانیت، با باش گوێ گرتن

---

(٧) أخرجه أحمد في المسند: (٥ /٨٦)، وانظر: صحيح الجامع الصغير: ٤٨٢٢، صحيح سنن الترمذي: ٢٨٥٠، ومختصر الشمائل المحمدية.
(٨) أخرجه البخاري (٦٠١٨)، ومسلم (٤٧).

ڕەوشتت بێت، با باش وەڵام دانەوەت دروشمی کەسایەتیت بێت.

٩- وریا بە لە گاڵتە کردن بە قسەی خەڵکی و بەکەم زانینیان وەکوو کەسێک کە سەر زمان بگرێت یان وتەی باش بۆ دەرنەبڕدرێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ ﴾ [الحجرات: ١١]. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە با کەس لە ئێوە گاڵتە بە کەسێکی تر نەکات چونکە لەوانەیە گاڵتە پێکراو لای خوای گەورە باشتر بێت لە گاڵتە پێکەر، با هیچ ئافرەتێکیش گاڵتە بە هیچ ئافرەتێکی تر نەکات، چونکە لەوانەیە ئافرەتی گاڵتە پێکراو لای خوای گەورە باشتر بێت لە ئافرەتی گاڵتە پێکەر.

پێغەمبەریش -ﷺ- دەفەرموویێت: «**المُسْلِمُ أخُو المُسْلِم، لا يَظْلِمُهُ، ولا يَخْذُلُهُ، ولا يَحْقِرُهُ، بحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أخاهُ المُسْلِمَ**»[٩]. واتە: موسڵمان برای موسڵمانە، نابێت ستەمی لێ بکات، سەرشۆڕی بکات، بە چاوی کەم

---

(٩) أخرجه البخاري (٦٠٦٤) مختصراً، ومسلم (٢٥٦٤) باختلاف يسير.

تەماشای بکات، بەسە بۆ مرۆڤـ کە بە خراپ بژمێردرێت کە بەچاوی سووک و کەم لە برایەکی موسڵمانی بڕوانێت.

١٠- ئەگەر گوێت لە قورئانی پیرۆز بوو، ئەوە بێدەنگ بە و قسەکانت ببڕە ئەگەر هەر بابەتێک بوو، ئەمەش وەک ڕێز و ئەدەبێک بەرانبەر فەرموودەی خوا و ڕێز گرتن لێی و جێبەجێ کردنی ئەم فەرمایشتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ [الأعراف: ٢٠٤]. واتە: ئەگەر قورئان خوێنرا، ئەوا گوێی لێ بگرن و بێدەنگ بن، بەڵکوو خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات.

١١- کۆشش بکە بۆ کێشانی قسەکانت لە دڵی خۆتدا و بزانە باشە یان نا پێش ئەوەی زمانت دەریبڕێت، سوور بە لەسەر ئەوەی قسەکانت سوودبەخش و چاک بێت و لە ڕێگای کاری چاک و باشدا بێت، دوور بێت لە خراپە و ئەوەی دەتگەیەنێت بە تووڕە بوونی خوای گەورە، چونکە قسەکردن لێپرسراوێتییەکی گەورەیە، هەر قسەیە کە خاوەنەکەی دەخاتە بەهەشتەوە، هەر قسەشە کە خاوەنەکەی فڕێدەداتە ناو قوڵایی ئاگری دۆزەخەوە، پێغەمبەر-ﷺ- دەفەرموێت: «**إنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِن رِضْوانِ اللَّهِ، لا**

**يُلْقِي لها بالاً، يَرْفَعُهُ اللَّهُ بها دَرَجات، وإنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ مِن سَخَطِ اللَّهِ، لا يُلْقِي لها بالاً، يَهْوِي بها في جَهَنَّمَ»**[١٠]. واتە: بەندەی وا هەیە قسەیەک دەکات لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا و بە خۆی نازانێت و گرنگی پێ نادات، بەڵام خوای گەورە چەندە پلە پێی بەرزی دەکاتەوە، بەندەی واش هەیە قسەیەک دەکات لە تورە بوونی خوای گەورەدا و بەخۆی نازانێت و گرنگی پێ نادات، بەهۆیەوە دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

موعازی کوڕی جەبەل -خوا لێی ڕازی بێت- کاتێ پرسیاری لە پێغەمبەر -ﷺ- کرد: «**وإنَّا لمؤاخَذونَ بما نتكَلَّمُ بِهِ ؟ فقالَ : ثَكِلَتكَ أمُّكَ يا معاذُ ، وَهَل يَكُبُّ النَّاسَ في النَّارِ على وجوهِهِم أو على مَناخرِهِم إلَّا حَصائدُ ألسنتِهِم**»[١١].

واتە: ئایا ئێمە لێمان دەگیرێت و لێمان دەپرسرێتەوە سەبارەت بەو قسانەی کە دەیکەین؟ پێغەمبەر -ﷺ- فەرمووی: لەبار دایکت بچوویتایە ئەی موعاز، ئایا کاتێک کە

---

(١٠) أخرجه البخاري (٦٤٧٨).

(١١) أخرجه الترمذي (٢٦١٦) بلفظه، وابن ماجه (٣٩٧٣)، وأحمد (٢٢٠٦٨).

مرۆڤـ لەسەر ڕوو دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە هەر لەبەر زمانی نییە.

١٢- زمانت بەکار بهێنە کە بەخششێکی گەورەیە لە لایەن خواوە بۆ فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگریکردن و بەرهەڵستی کردن لە خراپە، بانگەواز کردن بۆ چاکە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ [النساء: ١١٤]. واتە: خێر و چاکە لە زۆر قسە و چپە چپەکانیاندا نییە مەگەر کەسێک فەرمان بکات بە خێر یاخود چاکە یاخود چاکسازی لە نێوان خەڵکیدا.

**فێربوون:**

**خوشکی موسڵمانم:**

١٣- فێربوون کارێکی چاکە و ڕێگایەکی باش و دروستە، لە شیفائی کچی عەبدوڵڵاوە -خوای لێ ڕازی بێت- دەڵێت: «**دخلَ عليَّ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم وأنا عند حفصةَ فقال لي: ألا تُعلِّمينَ هذهِ رُقيةَ النَّملةِ كَما علَّمتيها الكِتابةَ**»[١٢]. واتە: پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاتە ژوورەوە بۆ لام

(١٢) أخرجه أبو داود (٣٨٨٧) واللفظ له، وأحمد (٢٧٠٩٥) باختلاف يسير، وصححه الألباني في صحيح أبي داود (٣٨٨٧).

و منیش لای حەفسە بووم -خوای لێ ڕازی بێت- پێی فەرمووم: ئایا حەفسە فێری دوعای نەملە ناکەیت [١٣]، هەروەک چۆن فێری خوێندن و نووسینت کرد.

١٤- مەبەست لە فێر بوون بەدەست هێنانی بڕوانامە و پلە بەرزی و دەستکەوتنی هەلی کار نییە لە فەرمانگە و کارگەیەک، بەڵکوو فێربوونی کاروباری دین و زانینی حوکمەکانێتی، هەروەها جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزە، تا ئافرەت بتوانێت لەسەر بەرچاوڕۆشنی پەروەردگاری بپەرستێت، هەروەک مەبەست لێی فێربوون زانینی ڕێگاکانی پەروەردەی ڕاست و دروستە، هەروەک چۆن ئەمە ڕەنگی دابۆوە لە ژیانی پێغەمبەر -ﷺ- و ژیانی هاوەڵانی و پێشینە چاکەکانی ئەم ئوممەتەدا -خوا لێیان ڕازی بێت-، هەموو ئەمانە لەپێناو ئەوەی کچان و ئافرەتان بە بەختەوەری بژین.

١٥- دوور بکەوەرەوە لە بەکەم زانین و گاڵتە کردن بەو خوشکانەت کە خوێندەوار و شارەزا نین، لەخۆ بەرز کردنەوە و خۆبەگەورەزانین لەوانەی لەخوار خۆتەوەن لە فێربوون و زانیاریدا، با خۆ بەکەم زانین و ڕاخستنی باڵی خۆبەکەمزانی

---

(١٣) ڕوقیەی نەملە: برینێکە کێم و زوخاو دەکات لە لایەکانەوە دەردەچێت.

زیاتر بەرزت بکەنەوە لە پلەکانی فێربووندا، ئەگەر نا ئەوا زانست و زانیارییەکەت دەبێتە بەڵا بەسەرتەوە، لە کەعبی کوڕی مالیکەوە -خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت: گویم لە پێغەمبەری خوا بوو -ﷺ- دەیفەرموو: «**مَنْ تعلَّمَ العلْمَ ليُباهِيَ بِهِ العلماءَ ، أَوْ يُمارِيَ بِهِ السفهاءَ، أَوْ يصرِفَ بِهِ وجوهَ الناسِ إليه، أدخَلَهُ اللهُ جهنَّمَ**»(١٤). واتە: هەر کەسێک زانست فێربێت بۆ ئەوەی شان بەشانی و ململانێی زانایانی پێ بکات، یاخود دەمەقاڵێی خەڵکانی گێل و گێژی پێ بکات، یان ڕووی خەڵکی پێ وەربگێڕێت بۆ لای خۆی، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## گوێ گرتن و بیستن:

١٦- گوێت بەدوور بگرە لە گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسیقا و هەر قسەیەکی خراپ و نەشیاو.

## پۆشاک:

١٧- خوشکی ئازیزم! تۆ موسڵمانی، بۆیە بێگومان دەبێت پۆشاکەکەت هەموو سیفات و مەرجی شەرعی تێدا بێت، واتە: با فراوان بێت و شۆڕ بێت و ئەستوور بێت و سەرەنج

---

(١٤) أخرجه أبو داود (٣٦٦٤)، وأحمد (٨٤٥٧) بمعناه، وابن ماجه (٢٦٠) باختلاف يسير، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٦١٥٨).

ڕاکێش نەبێت و ڕەنگا و ڕەنگ نەبێت و لە پۆشاکی پیاو نەچێت و لە پۆشاکی ئافرەتی بێ باوەڕ نەچێت.

١٨- با سەردەست و ملیوانی جلەکانت زۆر فراوان نەبێت، چونکە ئافرەت لە کاتی ڕۆیشتن و هاتن و سواربوونی سەیارە و دابەزینی لەوانەیە شوێنێکی دەربکەوێت.

## کۆڕوکۆبونەوە و دانیشتنەکان:

١٩- ئاگادار بە -خوا بت پارێزێت- لە ئامادەبوونی دانیشتن لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ناشەرعی و خراپ و تێکەڵاو بوون بە خەڵکی خراپ، خێرا و پەلە بکە -خوا چاودێری و چوست و چالاکت بکات- لە ئامادەبوون لە کۆڕ و کۆبوونەوە و دانیشتنی باش.

٢٠- ئەگەر دانیشتیت لەناو کۆمەڵە خوشکێکتدا یاخود بەتەنها بوویت با زیکر و یادکردنی خوای گەورە بەردەوام لەسەر زمانت بێت، تا بە خێر بۆتان بگەڕێتەوە وپاداشتتان دەست بکەوێت، پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەفەرمووێت: «مَن

**قَعَد مَقعدًا لم يذكرِ اللهَ فيه؛ كان عليه من اللهِ تِرَةٌ، ومن اضطجع مضجعًا لا يذكرِ اللهَ فيه؛ كانت عليه من اللهِ تِرَةٌ»**(١٥).

واتە: هەر کەسێک لە شوێنێکدا دابنیشێت و یادی خوای گەورە نەکات، ئیللا پەشیمان دەبێتەوە و لەلایەن خوای گەورەوە تووشی کەمی پاداشت دەبێت، هەر کەسێک لە شوێنێکدا ڕابکشێت و یادی خوای گەورە نەکات، ئیللا پەشیمان دەبێتەوە و لەلایەن خوای گەورەوە تووشی کەمی پاداشت دەبێت. واتە: لە ڕۆژی دواییدا تووشی پەشیمانی دەبێت، بەوەی ئەو هەلەی نەقۆستۆتەوە و سوودی لێ نەبینیوە.

ئەگەر ویستت هەڵسیت لە شوێنێکا لە یادت نەچێت بڵێ: **«سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ»**(١٦).

تا خوای گەورە لە هەر تاوانێکت خۆش بێت کە لەو شوێن و کۆڕ و مەجلیسەدا کردووتە.

---

(١٥) أخرجه أبو داود (٤٨٥٦)، واللفظ له، والنسائي في (السنن الكبرى) (١٠٢٣٧)، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود: (٥٠٥٩).
(١٦) أخرجه الترمذي (٣٤٣٣) واللفظ له، والنسائي في (السنن الكبرى) (١٠٢٣٠)، وأحمد (١٠٤١٥) باختلاف يسير، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي: (٢٧٣٠).

٢١- خوشکی موسڵمان کۆڕوکۆبوونەوەکەت پاک بکەرەوە لە باسکردنی خەڵک و قسە و باس و دوو زمانی، ئەمەش وەک جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا و لە ترسی سزای ئەو، چونکە ئەمانە سیفەتی سەرزەنشتکراو و ئەخلاقی قێزەونن، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُۚ﴾ [الحجرات: ١٢]. واتە: بەشوێن کەموکوڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملە باسی یەکتری بەخراپ مەکەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە.

٢٢- ئەگەر یەکێک لە ئامادەبووان وشەیەکی ناپەسەندی لێوە دەرچوو یان هەڵەیەکی کرد، ئەوا ئەرکی تۆیە دوای دەرچوونی لە کۆڕەکە بە قسەی خۆش و شێوازێکی جوان و باش ئامۆژگاری بکەیت.

## کتێبخانە:

٢٣- سوور بە لەسەر بەدەستهێنانی کتێبی بەسوود و هەڵبژێردراو بۆ ئەوەی ببێتە کتێبخانەیماڵەوە کە هەموو ئەندامانی خێزانەکەت بتوانن سوودی لێ وەربگرن.

٢٤- وریا بە خوشکی موسڵمان، کاتی خۆت لە خوێندنەوەی شتە بێ کەڵکەکان بەفیڕۆ نەدەیت، دوور بکەوەرەوە لە خوێندنەوەی شتە زیانبەخشەکان، وەک گۆڤاری پووچ و ڕۆمانی کوالیتی نزم کە نووسەرەکانیان هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپەکاری و بڵاوکردنەوەی فەسادی دەدەن، ئاگادار بە لەوەی ئەم جۆرە پەرتووکانە بێنە ناو ماڵەکەتەوە.

٢٥- شتێکی بەسوودە گەر کتێبخانە هەمەچەشن بێت، هەموو پێداویستییەکان دابین بکات، چارسەری بابەتگەلێکی جۆراوجۆر بکات، چونکە بەڕاستی پیاو و ئافرەتی موسڵمان پێویستیان بە زانینی وردەکاری ئایینەکەیان و بابەتە عەقیدەیی و ئیمانیەکانە، هەروەها ئاگاداربوون لە هەواڵی جیهانی ئیسلامیی و زانین و ئاشنا بوون بە کێشەی موسڵمانان، لەگەڵ ئاگادار بوون لەو ئامرازانەی کە یارمەتیدەرن بۆ پەروەردەکردنی خۆیان و نەوەکانیان، وەک ڕوانین و وردبوونەوە لە سیرە و ژیاننامەی سەلەفی ساڵح و وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری لێی.

٢٦- ئەگەر کتێبێکی بەسوودت بەدڵ بوو، پێویستە خوشکە موسڵمانەکانت لەو بارەیەوە ئاگادار بکەیتەوە و

هانیان بدەیت بۆ خوێندنەوەی، هەروەها ئەگەر کتێبێکت بەرچاو کەوت کە زیانی هەیە یان جێی تێبینی بوو، دەبێت خوشکە موسڵمانەکانت ئاگادار بکەیتەوە لە زیانەکانی و ئەو هەڵانەی تێیدایە.

٢٧- خوێندنەوە گرنگ و پێویستە، بۆیە هەوڵبدە -خوا یارمەتیت بدات- دەرفەتەکان بقۆزیتەوە و کاتەکانی ژیانت بەهەل بزانیت و هەوڵدەی لە بەدەستهێنانی زانست و زانیاری بەسووددا بەکاری بێنیت.

## چوونە دەرەوە بۆ بازاڕ:

٢٨- ئارەزووی چوونە دەرەوە مەکە ئەگەر کەسێکت دەستکەوت کە پێداویستیەکانت دابین بکات، ئەگەر ناچار بوویت بچیتە دەرەوە با بۆ ماوەیەکی کورت بێت بەپێی پێویستی خۆت.

٢٩- ئەگەر چوویتە دەرەوە بۆ بازاڕ، ئاگادار بە لە لەخۆدانی بۆنی خۆش و خۆ ڕازاندنەوە و لەبەرکردنی جلوبەرگی جوان کە سەرنجی خەڵکت بۆ ڕابکێشێت، لە ئەبوو مووساوە -خودا لێی ڕازی بێت-، لە پێغەمبەرەوە -ﷺ- کە فەرموویەتی: «**أيُّما امرأةٍ استعطَرَت فمرَّت علَى قومٍ**

**ليجِدوا من ريحِها؛ فَهيَ زانيةٌ»**[(١٧)]. واتە: هەر ئافرەتێک خۆی بۆن خۆش بکات و بەلای گەلێکدا تێپەڕێت تا بۆنی بۆنەکەی بکەن؛ ئەوا زیناکارە.

با جلەکانت فراوان بن و هەموو بەشەکانی لەش داپۆشن.

٣٠- ئەگەر لە بازاڕدا بوویت یان لە ڕێگادا بوویت بۆی، زۆر بەرمەکەرە دواوە و سەیری ئەملاوئەولا مەکە، چونکە بینین تەڵەی مەترسیداری هەیە، ئەگەر پێویستیەکەت جێبەجێ کرد ئامان ئاگاداربە لە قسەکردنی زۆر لەگەڵ فرۆشیارەکان، چونکە ئەوە شتێکە ئاوی حەیات ناهێڵێ و دەرگای فیتنە دەکاتەوە.

٣١- ئەگەر خراپەیەکت لە بازاڕدا بینی یان لە ڕێگای چوون بۆ بازاڕ، دەبێت ئیدانەی بکەیت، ئەگەر نەتوانی بەزمانی نکۆڵی لێبکەیت، ئەوا بەدڵ پێت ناخۆش بێت و لەدڵەوە ڕقت لێی بێت و ئیدانەی بکە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ [التوبة: ٧١]. واتە: ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و

---

(١٧) أخرجه النسائي: (٥١٤١). وحسنه الألباني في صحيح النسائي: (٥١٤١).

پشتگیر و هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفەتیانە): فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان.

٣٢- هەندێک لە خانمان چوونە دەرەوە بۆ بازاڕ وەکوو سەیرانێکی ڕۆژانە دەزانن، زۆرجار دەچنە دەرەوە و دەیانبینیت ڕۆژانە بەڕێگای بازاڕەون، پەنا بە خوا دەگرم کە تۆ لەم جۆرە بیت، بەو پێیەی ئەوانە لەو کەسانەن کە زۆرترین جار تووشی فیتنە دەبن و کاتەکانیان بەفیڕۆدەدەن.

٣٣- نەرم و نیان بە لەگەڵ خۆت و هاوسەرەکەتدا، پێویست ناکات لقێکی بازاڕ لەماڵەکەتدا هەبێت، بۆیە هیچ شتێک مەکڕە جگە لەوەی پێویستت پێیەتی.

**دوعا و پاڕانەوە:**

٣٤- تۆ لاوازی و پێویستت بە خودای گەورەیە و هەژاری بەردەرگای ئەوی، بۆیە هەمیشە دەستی پاڕانەوەت بۆ لای بەرز بکەرەوە، داوای لێبوردن و خۆشگوزەرانی و سەرکەوتنی لیَ بکە لە دونیا و قیامەتدا، تووشی خێر وخۆشی دەبی و نائومێدت ناکات، پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرموویەتی: «**إِنَّ اللَّهَ حيِيٌّ كريمٌ يَستَحي إذا رفعَ الرَّجلُ إليْهِ يديْهِ أنْ يَردَّهما**

**صِفرًا خائبتينِ**»[١٨]. واتە: بێگومان خودا بەشەرم و بەخشندەیە شەرم دەکات ئەگەر یەکێک دوو دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ لای ئەو بە بەتاڵی و نائومێدی بیگێڕێتەوە.

ئاگادار بە نەکەی پەلە بکەیت لە وەڵامدانەوەی دوعا و پاڕانەوەکانت؛ پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرموویەتی: «**ما مِن عبدٍ يرفعُ يديهِ حتَّى يبدوَ إبطُهُ يسألُ اللَّهَ مسألةً، إلَّا آتاها إيَّاهُ ما لم يَعجَلْ، قالوا: يا رسولَ اللَّهِ وَكَيفَ عجَلتُهُ؟ قالَ: يقولُ: قد سألتُ وسألتُ ولم أُعطَ شيئًا**»[١٩]. واتە: هیچ بەندەیەک نییە دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا بنباڵی دیار بێت، داوای شتێک لە خودا بکات، ئیللا خودا داواکارییەکەی پێدەدات بەمەرجێ پەلە نەکات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، چۆن پەلە دەکات؟ فەرمووی: دەڵێت: داوام کرد و داوام کرد کەچی هیچم پێنەبەخشرا.

پاڕانەوەکەت دەست پێ بکە بە ستایشکردنی خودا و سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا -ﷺ-، هەر بەووەش

---

(١٨) أخرجه الترمذي (٣٥٥٦)، وصححه الألباني في صحيح الترمذي (٣٥٥٦).

(١٩) أخرجه مسلم (٢٧٣٥) بنحوه، والترمذي (٣٦٠٤) واللفظ له، وأحمد (٩١٤٨) مختصراً، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي (٢٨٥٣).

کۆتایی پێبهێنە و بە دڵسۆزیەوە ڕوو لە خودا بکە، پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرموویەتی: «**ادْعُوا اللهَ وأنتمْ مُوقِنُونَ بالإجابةِ، واعلمُوا أنَّ اللهَ لا يَستجيبُ دُعاءً من قلْبٍ غافِلٍ لَاهٍ**»[(٢٠)]. واتە: داوا لە خودا بکەن بەشێوەیەک کە دڵنیان لە وەڵامدانەوەی خودا، بزانن کە خودا وەڵامی دوعایەک ناداتەوە لە دڵێکی بێباک و سەرقاڵەوە.

ئاگاداری دوعاکردنی خراپ بن یان پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی، ئەگەر وەڵامێکی ڕواڵەتیت بۆ دوعاکەت نەبینی، لەوە دڵتەنگ مەبە، چونکە ڕەنگە خودا بۆ ژیانی دوای مردن بۆت هەڵبگرێت، یان بیکاتە کەفارەتی گوناهەکانت، یان شتێکت لێ دوور بخاتەوە کە گەر ئەو دوعایە نەبووایە بەسەرتدا دەهات.

٣٥- لە ڕێگەی عیبادەتی فەرز و سوننەت و جۆرەها چاکەی ترەوە هەوڵی خۆ لە خودا نزیککردنەوە بدە، ئەوکات بێگومان پاداشتی گەورە بەدەست دەهێنیت و بەرز دەبیتەوە بۆ پلە بەرزەکان، دەبیت بە یەکێک لە دۆستەکانی خودا کە هیچ ترسێکیان لەسەر نییە و خەمبار نابن، خوداش وەڵامی

---

(٢٠) أخرجه الترمذي (٣٤٧٩) واللفظ له، والبزار (١٠٠٦١)، وحسنه الألباني في صحيح الجامع(٢٤٥).

دوعاکانیان دەداتەوە و نیگەرانییەکانیان لێدووردەخاتەوە و دڵیان پڕ دەکات لە ئارامی و بەخشندەیی، پێغەمبەر -ﷺ- فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطُشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَلَئِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ»[٢١].

واتە: بەڕاستی خوای بەرز و پایەدار فەرموویەتی: هەر کەسێک دژایەتی دۆستێکم بکات، ئەوا من جەنگی لەگەڵدا ڕادەگەیەنم، بەندەکەم بە هیچ شتێک لێم نزیک نابێتەوە خۆشەویستتر بێت لە لام وەکوو ئەوەی کە فەرزم کردووە لەسەری، بەردەوام بەندەکەم خۆیم لێ نزیک دەکاتەوە بە سوننەتەکان، تاوەکوو دەگاتە ئەو ئاستەی کە خۆشیم بوێت، ئەگەر خۆشیم ویست، ئەوا من دەبمە ئەو بیستنەی کە پێی دەبیسێت، ئەو بینینەی کە پێی دەبینێت، ئەو دەستەی کە پێی دەدات لە شتەکان، ئەو پێیەی کە ڕێی پێ دەکات، ئینجا

---

(٢١) أخرجه البخاري (٦٥٠٢).

ئەگەر داوام لێ بکات، ئەوا پێی دەبەخشم، ئەگەر پەنام پێبگرێت ئەوا پەنای دەدەم.

٣٦- ئەگەر ئافرەتێکی موسڵمانت بینی پابەندی دینەکەیەتی و وەڵامی فەرمانی پەروەردگارەکەی دەداتەوە و شانازی بە ئیمانەکەیەوە دەکات، ئەوا وای لێبکە هەست بە خۆشەویستی تۆ بکات و وەک هاوڕێیەکی نزیک وەریبگرە، چونکە خۆشەویستی لەبەر خودا پێگەیەکی هەرە بەرزی هەیە، پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرموویەتی: «**قال اللهُ عزَّ وجلَّ المتحابُّونَ في جلالي لهم منابرُ من نورٍ يَغبِطُهم النَّبيونَ والشُّهداءُ**» [٢٢]. واتە: خوای گەورە و باڵادەست فەرموویەتی: ئەوانەی کە لە پێناوی من یەکتریان خۆشویستووە مینبەری جوان و ڕازاوە و دروشاوەیان بۆ هەیە، کە پەیامبەران و شەهیدان ئاواتیان پێ دەخوازن.

[لەچەندین فەرموودەی تردا فەزڵی خۆشەویستی لەبەر خودا ڕوونکراوەتەوە، لەوانە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «**زارَ رجُلٌ أخًا لَهُ في قريَةٍ فأرْصَدَ اللهُ لَهُ ملكًا علَى مَدْرَجَتِه، فقال : أينَ تُرِيدُ؟ قال: أخًا لِي في هذِهِ القرْيَةِ، فقال: هل لَّهُ**

---

(٢٢) أخرجه الترمذي (٢٣٩٠)، وأحمد (٢٢٠٨٠)، وصححه الألباني في صحيح الترغيب (٣٠١٩).

**عليكَ مِنْ نعمةٍ تربُّها ؟ قال: لَا ؛ إلَّا أنيِّ أُحِبُّه فِي اللهِ، قال: فإِنِّي رسولُ اللهِ إليكَ أنَّ اللهَ أحبَّكَ كمَا أَحْبَبْتَهُ»**(٢٣).

واتە: پیاوێک سەردانی برایەکی دەکرد لە لادێیەکی تر، جا خوا فریشتەیەکی ناردە سەر ڕێگەی و پێی گەشت پێی فەرموو: بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی: دەچم بۆلای برایەکم لەم لادێیە، فریشتەکە فەرمووی: ئایا هیچ ماف و بەرژەوەندییەکی دونیاییت هەیە بەسەریەوە؟ پیاوەکە گوتی: نەخێر تەنها ئەوەندەیە کە لە پێناو خوادا خۆشم دەوێت، فریشتەکە فەرمووی: جا بزانە من نێرداری خودام بۆ لای تۆ کە خوا بەڕاستی خۆشی دەوێت هەروەکوو چۆن ئەو کەسەت لە پێناوی ئەودا خۆش دەوێت].

هەروەها پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرموویەتی: «**قالَ اللهُ عزَّ وجلَّ: وَجَبَتْ مَحبَّتي للمُتحابِّينَ فيَّ**»(٢٤). واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: خۆشەویستیم بۆ ئەو کەسانەی کە لەپێناوی من یەکتریان خۆش دەوێت پێویست بووە لەسەرم.

---

(٢٣) أخرجه البخاري في (الأدب المفرد) (٣٥٠)، ومسلم (٢٥٦٧) باختلاف يسير. وصححه الألباني في صحيح الجامع | (٣٥٦٧).

(٢٤) أخرجه أحمد (٢٢٠٣٠) واللفظ له، ومالك (٢ /٩٥٣)، والطحاوي في (شرح مشكل الآثار) (٣٨٩٠). وصححه شعيب الأرناؤوط في تخريج المسند لشعيب (٢٢٠٣٠).

٣٧- ئەگەر کاتەکانت بە باشی دابەش نەکەیت، ئەوا بەفیڕۆ دەدەیت و لەدەستت دەچێت، بۆیە پێویستە وانەکانت بخوێنی -ئەگەر خوێندکار بیت- ئەرکەکانی خێزانەکەت یان هاوسەرەکەت جێبەجێ بکەیت، زانیاری بەسوود بەدەست بهێنیت، شتی بەسوود بخوێنیتەوە و سەردانی خزمەکانت بکەیت.

٣٨- سەردانکردنی خزم و کەسوکار دەبێتە هۆی بەرەکەتدار بوونی تەمەن و دەستخستنی بژێوی ژیان، بۆیە سوور بە لەسەر سەردانی خزمەکانت، با سەردانیکردنەکەت بۆ لایان سودبەخش بێت، هانیان بدە بۆ خێر و چاکە، لەترسناکی و ئەنجامی کاری خراپە ئاگاریان بکەرەوە، بە باشترین شێوە ئامۆژگارییان بکە، لەگەڵ دڵنیا بوونەوە لە بارەی تەندروستیان و پرسیارکردن لەسەر بارودۆخی ژیانیان، پێغەمبەر -ﷺ- فەرموویەتی: «**مَن سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ له في رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ له في أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ**»[٢٥].

واتە: ئەوەی پێی خۆشە ڕزقی فراوان بێت و شوێنەواری دوای خۆی بمێنێتەوە، ئەوا با سیلەی ڕەحم و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت.

---

(٢٥) أخرجه البخاري (٢٠٦٧).

٣٩- فریو مەخۆن بەهۆی ئەو ژمارە زۆرەی سەرپێچیکارانی فەرمانی خودا و ئەوانەی کەمتەرخەمن لە جێبەجێکردنی یاسا و شەریعەتەکەیدا، چونکە ڕۆژێک دێت کە ستەمکار دەستی خۆی دەگەزێت، کەسی ئیمانداریش زۆر دڵخۆش دەبێت بە ڕزگاربوونی، لەکاتێکدا ترسناکییەکانی قیامەت دەبینێت، بۆیە هیچ بژاردەیەکی نییە جگە لە گوتنی -لەکاتێکدا نامەی کردەوەکانی بە دەستی ڕاستی گرتووە-:﴿ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ١٩ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴾ [الحاقة: ١٩- ٢٠]. واتە: ها ئەوەتا نامەی کردەوەکانم بیگرن و بخوێننەوە و تەماشای بکەن. بەڕاستی من کاتی خۆی سوور دەمزانی و دڵنیابووم کە بەم لێپرسینەوە دەگەم!!

٤٠- ڕەحم و میهرەبانی لە دڵتدا بچێنە و ڕەحم بە بچووک و گەنج و پیر، تەنانەت ئاژەڵانیش بکە، پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرموویەتی: «**مَن لا يَرحَمْ، لا يُرحَمْ**»[٢٦]. واتە: ئەوەی ڕەحم بەخەڵکی نەکات ڕەحمی پێناکرێت.

لەفەرموودەیەکدا هاتووە، پێغەمبەر -ﷺ- فەرموویەتی: «**بينَما رجلٌ يمشي بِطريقٍ اشتَدَّ بهِ العَطشُ، فوجدَ بئرًا فنزلَ فيها، فشرِبَ ثمَّ خرجَ، فإذا كلبٌ يلهَثُ، يأكُلُ الثرَى من**

---

(٢٦) أخرجه البخاري (٥٩٩٧)، ومسلم (٢٣١٨).

العَطشِ، فقال الرَّجُلُ: لقد بلغَ هذا الكلبُ من العَطشِ مِثلَ الَّذي كان بلغَني، فنزلَ البِئرَ فملأَ خُفَّهُ ثمَّ أمسكَه بفِيه فسَقَى الكلبَ، فشكرَ اللهُ لهُ، فغَفرَ لهُ. قالوا: يا رسولَ اللهِ، وإنَّ لنا في البهائمِ أجرًا؟ قال: في كُلِّ كَبِدٍ رطبَةٍ أجرٌ»[٢٧].

واتە: لە کاتێک دا پیاوێک دەڕۆیشت بە ڕێگایەکدا زۆر تینوی بوو بیرێکی ئاوی بینی، دابەزی بۆ ناو بیرەکە و ئاوی خواردەوە، لە پاشاندا دەرچوو تەماشای کرد سەگێک لە تینوودا زمانی دەرکرد بوو خۆڵی زەویەکەی دەخوارد، پیاوەکە گوتی: بەڕاستی ئەم سەگە توشی تینویەتییەک بووە وەکوو تینویەتییەکەی من، پیاوەکە دابەزی بۆ ناو بیرەکە و خوفەکەی پڕکرد لە ئاو، پاشان بەدەمی گرتی هەتاوەکوو سەرکەوتە سەرەوە و سەگەکەی تێر ئاو کرد، لە پاشان خوای گەورە سوپاسی ئەو پیاوەی کرد و لێیشی خۆش بوو.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئایا لەبەرانبەر [خواردن و خواردنەوەدان] بە ئاژەڵان پاشاداشتمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: لەهەموو خاوەن جەرگێکی تەڕ و زیندوو پاداشت هەیە.

---

(٢٧) أخرجه البخاري (٢٣٦٣) وفي (الأدب المفرد) (٣٧٨) واللفظ لـه، ومسلم (٢٢٤٤). وصححه الألباني في صحيح الأدب المفرد (٢٩١).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -خوا لێیان ڕازی بێت- گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: «**عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ في هِرَّةٍ سَجَنَتْها حتَّى ماتَتْ، فَدَخَلَتْ فيها النَّارَ، لا هي أطْعَمَتْها ولا سَقَتْها، إذْ حَبَسَتْها، ولا هي تَرَكَتْها تَأْكُلُ مِن خَشاشِ الأرْضِ**»[٢٨]. واتە: ئافرەتێک سزا درا لەسەر پشیلەیەک، بەندی کردبوو تاکوو مرد، بەهۆی ئەو پشیلەیەوە چووە دۆزەخەوە، چونکە نە ئەوەبوو خۆراک و ئاوی بداتێ کە بەندی کردبوو، نە ئەوەش بوو وازی لێ بهێنێت بۆخۆی پەلەوەری سەرزەوی بخوات.

٤١- ئاگاداری بانگخوازانی خراپە و خۆنمایشکەرانی پێشکەوتن بن کە بەدبەختی و خۆبەزلزانینی خۆیان دەهێنن بۆ لەخشتە بردنی کچ و ئافرەتە موسڵمانەکان، دەرهێنانیان لە پاراستن و پاکیزەییەوە بەرەو ڕووتی و بێ ڕەوشتی، بە بەکارهێنانی ئامراز و شێوازی جۆراوجۆر، خوشکەکانتان ئاگادار بکەنەوە کە نەکەونە چنگ و داویانەوە و بە قسە باق و بریقەکانیان فریو نەدرێن.

٤٢- شانازی بە دین و ئیمان و عەقیدەکەتەوە بکە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾

---

(٢٨) أخرجه البخاري (٣٤٨٢)، ومسلم (٢٢٤٢).

[آل عمران: ١٣٩]. واتە: ئێوە براوە و باڵادەستن ئەگەر ئیماندار بن. ئاگاداربە لەوەی شەرم بکەیت لە نمایشکردنی ڕێوڕەسمەکانی دینەکەت یان شاردنەوەی.

٤٣- ئاستی ڕۆشنبیری ئیسلامیی خۆت پەرە پێبدە بە گوێگرتن لە وتار و سیمینارە ئیسلامییە بەسوودەکان، تەنانەت ئەگەر لە ڕێگەی موبایل و ڕادیۆوە بێت، سوور بە لەسەر خوێندنەوەی گۆڤاری بەسوودی ئیسلامیی.

٤٤- یارمەتیدەر بە لە بڵاوکردنەوەی چاکە و ئاکار و ڕەوشتی جوان و زانستی بەسوود لە ماڵەکەت و قوتابخانە و لەناو خزم و هاوڕێکانتدا.

٤٥- سوور بە لەسەر یارمەتیدانی دایکت لە کارەکانی ماڵەوەدا، چونکە ئەمە نیشاندانی میهرەبانییە بۆی و پاداشتدانەوەی بەشێک لە میهرەبانییەکانیەتی. هەروەها جۆرێکیشە لە ڕاهێنان بۆ تۆ لەخۆدەگرێت بۆ ئەوەی تۆ -إن شاءالله- لە ژیانی داهاتوودا سەرکەوتوو بیت.

ئاگاداربە لە پەنابردن بۆ پشوودان و تەمبەڵی بەناوی تەرخانکردنی خۆت بۆ خوێندن و یادخستنەوەی وانە و ئەنجامدانی کاری قوتابخانە.

٤٦- هەمیشە زەردەخەنە بکە، بەو پێیەی ئەمە هیچ تێچوویەکی تێ ناچێت، لە هەمان کاتدا خۆشەویستی کەسانی ترت بۆ دەهێنێت و پاداشت لەسەری وەردەگریت. پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرمووی: «**تبسُّمُكَ في وجْهِ أخيكَ لَكَ صدقةٌ**»[٢٩]. واتە: زەردەخەنەت بە ڕووی براکەتدا خێر و چاکەیە.

٤٧- ئاگاداری توڕەیی و هەڵچوون و وروژاندن بن، لە ئەبوو هورەیرەوە -خوا لێی ڕازی بێت- هاتووە، دەڵێت: «**أنَّ رجلًا قال: يا رسولَ اللهِ قُلْ لي قولًا وأَقْلِلْ لعلِّي أعِيه قال لا تغضبْ، فأعاد عليه مرارًا، كلُّ ذلك يقولُ : لا تغضَبْ**»[٣٠]. واتە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا -ﷺ- قسەیەکم پێ بڵێ بەڵکوو لێی سوودمەند بم، فەرمووی: تووڕە مەبە، چەند جارێک دووبارەی کردەوە، فەرمووی: تووڕە مەبە.

---

(٢٩) أخرجه الترمذي (١٩٥٦) واللفظ له، وابن حبان (٥٢٩)، وابن عدي في (الكامل في الضعفاء) (٥ /٢٧٥) باختلاف يسير. وصححه الألباني في صحيح سن نالترمذي (١٥٩٤).

(٣٠) أخرجه أحمد (١٥٩٦٤)، وابن أبي شيبة (٢٥٣٨٠)، وهناد بن السري في (الزهد) (٢/ ٦٠٧) واللفظ لهم جميعا. وصححه الألباني في صحيح الترغيب (٢٧٤٨).

بزانە و دڵنیابە لەوەی تووڕەیی لەشەیتانەوەیە، پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرموویەتی: «**إنَّ الغضَبَ مِنَ الشيطانِ، وإنَّ الشيطانَ خُلِقَ منَ النارِ، وإنَّما تُطفأُ النارُ بالماءِ، فإذا غضِبَ أحَدُكم فلْيَتوضَّأْ**»(٣١).

واتە: توڕەیی لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگر دروست بووە، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، بۆیە ئەگەر یەکێک لە ئێوە تووڕە بوو با دەستنوێژ بگرێت.

کەسی تووڕە کەسی دەستناکەوێت کە سەبر و ئارامی و خۆڕاگری لەگەڵیدا هەبێت و لەگەڵی هەڵکات، بۆیە لێبوردن بە و بەرگەی هەڵە و کەموکوڕیەکانی خەڵک بگرە.

٤٨- ئاگاداری لاسایی کردنەوەی کافرەکان بن لە داب و نەریتی و شێوازی خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و شتی تردا، پێغەمبەری خودا -ﷺ- فەرموویەتی: «**مَنْ تشبَّهَ بقومٍ فهوَ منهم**»(٣٢). واتە: هەر کەسێک خۆی بچوێنێت بەهەر کەس و گەلێک، ئەوا لەوانە.

---

(٣١) أخرجه أبو داود (٤٧٨٤)، وأحمد (١٧٩٨٥)، وحسنه شعيب الأرناووط في تخريج شرح السنة (٣٥٨٣).

(٣٢) أخرجه أبو داود (٤٠٣١) واللفظ له، وأحمد (٥١١٤) مطولاً، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود (٤٠٣١).

٤٩- زۆرێک لە ئافرەتان کەمتەرخەمن لە بابەتی نوێژ و دوایدەخەن و لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجامی نادەن، کاتێک سەرقاڵی کارەکانیانن یان سەرقاڵ دەبن بە قسەی بێهودە لەگەڵ کەسانی تر، بەتایبەتی لەکاتی بۆنە و ئاهەنگەکاندا، پەنا بە خودا دەگرم کە تۆ یەکێک بیت لەم کەسانە، لە کاتێکدا ئەم فەرمایشتەی خودای گەورە دەخوێنیتەوە: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ [الماعون: ٤- ٥]. واتە: جا هاوار و واوەیلا بۆ نوێژخوێنان. ئەو نوێژخوێنانەی گوێ نادەن بە نوێژەکانیان و کارگەری نییە لەسەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن.

واتە دوایدەخەن تا کاتەکەی تێدەپەڕێت.

٥٠- بەڕۆژووبوون پێگەیەکی بەرزی هەیە و پاداشتێکی گەورەی هەیە، هەروەها ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت لە پاککردنەوەی ڕۆح و پاڵاوتنی ویژدان، کارێکی زۆر باشە ئەگەر خۆت لەسەر ڕۆژووگرتنی سوننەت ڕابهێنیت، وەک شەش ڕۆژی شەوال و سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا.

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم.

## ناوەڕۆک